# ئه‌مین فه‌یضی



که‌ته‌شریفی شه‌ره‌فی هات [ ئه‌مین فه‌یضی ] بـه‌میوانی
ئه‌مه‌نده‌ی شوکری ده‌رناچم ئه‌که‌ر خۆم که‌م به‌قوربانی

**شێخ رەزا**

# ئەنجومەنی ئـەدیبانی کورد

## ئەمین فەیضی بەگ

١٨٦٠ — ١٩٢٣

چاپی یەکەم لەچاپخانەی « تەرجومانی حەقیقەت »
لە ئەستەموول ربیع الاولی سالی ١٣٢٩ ڕۆمی چاپ کراوە
چاپی دووەم

# ئەنجومەنی ئـەدیبانی کورد
# و
# ئەمین فەیضی بەگب

دەورو بەری شەست سالێک لەمەو بەرو لە ولاتی غەریبیدا،لەشاری ئەستەموول سەربازێکی دڵسۆزو زانایەکی نووسەرمان . کتێبێکی بەفرخی بە ناوی [ ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد ] ەوە دەر کردو لـە کۆتایی ژیانیداو پێش ئەوەی چاوی ژیانو تەمەنی لێک بنێت ، چاوی خۆی و هاو خۆیەکانی بەو بەرهەمە رابەرو تاقانەو خۆشەویستـە گـەش‌و رووناک کردەوە.

ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد ،یەکەم کتێبی ئەدەبی‌و بکرە رۆشنبیریمانە، کەوەک سەرچاوەیەکی رووناک دەربارەی کۆمەلێك لە شاعیرە ناودارەکانی وەك [نالی،سالم،کوردی،شێخ رەزا، مەولەوی ، ئەحمەدی کۆر ،مەولاناخالد، ئاهی]و شاعرانی تری کـورد

بدویت و بەو پەری شارەزایی‌و دەست‌پاکی‌و
دڵسۆزی‌یەوە، بە چەند نموونەیەکی بەرز لە بەرهەمی
هەر یەکێك لەو شاعرانە، کتێبە نازدارەکەی بڕاز
ێنێتەوەو بە هەست و کیانێکی گەرم و پەرۆشەوە لە
پێشەکی ئەو کتێبەدا بلێت: ئودەباو شوعەرای کورد
زۆرن، لاکین ئاسەاریان بە تەواوی جەمع‌و تەئلیف
نەکراوە من نیەتم کرد کە بەعضێ لە ئەشعاری
کوردی بابان طەبع‌و نەشر بکەم تا بزانرێ موڵکی
بابان چەند مەنبەعی زەکایە... لەشعری هەر شاعرێ
چەند پارچەیەکم ئینتیخاب کردوو موتەخەباتە
ریسالەی (ئەنجومەنی ئەدیبان) م هێنایە وجوود»
ئەمەیە هەست‌ونەستو کیانی دڵداری‌وخۆشەویستی
راستەقینە بەرامبەر بەپیت‌و وشەو شیعرو ئەدەب‌و
زمانی شیرینی کوردیمان، ئەمەیە پێزانین و وەفاو
هەست کردنی قووڵ بەڵێ پرسینەوەی سەرشان بە
رامبەر بەو سەرچاوە گەشەی لێی هەڵقوڵاوین،
بەرامبەر ئەلەوەی کوردو خاکی پیرۆزی کوردستانمان

نووسەرو شاعیرێکی مەزن و زانایەکی گەورەی
وەکوو ئەمین فەیضی بەگ، بەبەرگی خاکی و
نیشتمانەی میر ئالاییەوە، لەدەرەوەی وڵات،
ئاگری جگەرو داسۆزییەکی بێوێنە هەڵی بکرێت و
بیخاتە سەر رێگای کۆکردنەوەو نووسینەوەو راست
کردنەوەو چاپکردنی کۆمەڵێك شیعری تەڕو پاراوی
باوی ئەوسەر دەمەی چەند شاعیرێکی ناودارمان و .
بۆ کوێ داڵە ئەخۆشی و پیری و دوور وڵاتی و نزیك
ی وتنەوەی مەرگ. بە چاپی بگەیەنێت و جوانترین
دیاری و یادگاری رەنج و تەقەلای شێوینی خۆمان
بۆ بەجێ بهێڵێت کتێبی [ ئەنجوومەنی ئەدیبانی
کورد ] یەکێکە لەو کتێبە دانسقەو نایابانەی
کە دەنگی نەبوو، رەنگی نەبوو . لەلای هەر
کەس و هەر کتێبخانەیەك سۆراغت دەکرد، بۆ
ئەنجام بوو دەست نەدەکەوت .

بایەخی ئەم کتێبە لەوەدایە کە بۆ یەکەم جار،
پێش ماوەی شەست ساڵێك، بیر لەم پڕۆژەنەدەیی یە

بەرزە کراوەتەوەو بە بەردی بنچینەی ئەم کارە گەورەیە، وەک رابەرێک، دادەنرێت، چونکە لەوەش یەک سەرچاوەیەکی نزیک بە سەردەی شاعرەکان ـزیان دەژمێررێت و دلسۆزانەو دەست پاکانەو شارەزایانە شیعرەکان هەلبژێرراون و چاپ کراون. لەم بارەیەوە، وەک سەرچاوەیەکی متمانە پێ کراو، تەماشای دەکرێت و هەلس و کەوتی لەگەلدا دەکرێت بۆنموونە تائێستا لە ناو رۆشنبیرانی کورددا مشتومر لە سەر ئەوەیە کە شیعری:

رەفیقان من ئەوا رۆیم لەلاتان

هی کوردیە یانهی نالیە؟ بۆ ئەوەی ئەمان ئاورێکمان لە (ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد) دایێتەوە کەبەناوی (نالی)یەوە چاپ کراوە. یان زۆر کەس وادەزانن کە پێنج خشتەکی یەکەی «سالم» لەسەر شیعرەکەی مەولاناخالد:

موسم عیداست وماتومیداز دیدار یار

عالم درعیش و نوش و ماو چشم اشکبار

سالی شاعر بە فارسی داینا وەو پیرەمێرد کردوویتی بە کوردی . کەچی راستی یەکەی ئەوەیە کە لە ( ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد ) دا بە کوردی بەو پیرەمێرد تەنها شیعرەکەی مەولانای کێڕیوە بە کوردی و کومانیش لەوەدایە کەئەو قەسیدەیە شەش پێنج خشتەکی بەو پیرەمێرد ،نارەوایانە ، دانەیەکی لێ زیاد کردبێت کەدەڵێت :

( شیوە سوور ) ، ئەشکی دیدەم پەیڕەوی لافاو ئەکەم
شەو بڵێسەم بەرزە وێنەی باوەکورکور ئاو ئەکەم
دەست شکستەم بۆیە مەیلی مومیای بێ خاو ئەکەم
باوە مردەی باوەمردەم ئاڵ بولاخە چاوەکەم

خۆزگە ئەم بیستە پێم بڵێن وا باوەکێڵدی کەییە شار ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد . لەرووی ناسینەوەو راست کردنەوەو بەراوردو چەندوردە کاری یەکی تری شیعرەوە جێگای متمانەو کەلکێکی باشە بۆ نووسەران و لێکۆڵەرەوەکان ، لەرووی زمان و رێنووسیشەوە ئاوێنەیەکی بێ گەردی زمان و رێنووسی

ئەو سەر دەمەیە وەك ئەو نمونەیەی لەدواوەی
کتێبەکەوە وەك خۆی نووسیمانەوە •
من لەنوسینەوەو چاپکردنەوەی ئەم کتێبەدا
هەموو ئەو راستیانەی لای سەرەوەم خستە بەر
چاو وەك خۆی ، ئەوەنەبێت کە رێنووسەکەیم
خستە سەر شێوەی رێنوسی ئەمڕۆمان ، بەلاوم
کردەوەو بەگوێرەی پێویستیش مانای هەندێ
وشەم لەداوێنەوە لێك داوەتەوە لەگەل چەند
سەرچنێکی زۆر پێویستدا •
ئەو سەرچاوانەی کەناوی دانەری « ئەنجومەنی
ئەدیبانی کورد »ی مامۆستا ئەمین فەیضی بەکیان
هێناوە زۆر کەمن و لەبەردەستدا . تێ ناپەڕن
ئەوانیش « ناودارانی کوردو کوردستانی »
مامۆستا ئەمین زەکی بەگ دا» و شیعرو ئەدەبیاتی
کوردی بەرگی یەکەمی مامۆستا رەفیق حیلمی«٢ و

١ـ مشاهیر الکرد و کردستان ١٩٤٥ م / ل ١١٩ ـ ١٢٠
٢ ـ شیعرو ئەدەبیاتی کوردی بەرگی یەکەم ١٩٤١ •

دەنگی گێتی تازە بە ناونیشانی [ ئەمین فەیضی بەگ شاعیر و زانا و پزیشکی مەزن ] کە مامۆستا حوزنی موکریانی نووسیویەتی «١» و [بیبلۆ گرافیای کتێبی کوردی ] مامۆستا مستەفا نەریمان «٢» و کتێبی «شێخ رەزای تاڵەبانی »لە نوسینی دکتور عیزەدین مستەفا رەسوول و گۆڤاری (بەیان) ی ژمارە [ ٢٤ ، ٣٥ ] ی سالی ٩٧٥ ، ١٩٧٦لە نووسینی مامۆستایان مستەفا نەریمان و ئەحمەد تاقانەو شاعیرە ناوون بووە کانی شاعیرەلی کەماڵ باپیر ئاغا .

جگە لە (بیلیو گرافیای کتێبی کوردی ) لە سەر چاوەکانی تر دا مێژووی لەدایک بوونی ئەم پیاوە مەزنە نەنوسراوەو لە کتێبی ( مشاهیر الکرد ) یشدا مێژووی کۆچ کردنی بە ١٩٢٨ازدراوەلەقەلەم . ئەمەش پێچەوانەی ئەو مێژووەیە کە خاوەنی (بیلۆ گرافیای کتێبی کوردی ) ١٩٢٧ ی نووسیوە .

---

١ ـ دەنگی گێتی تازە ١٩٤٥ ـ ژمارە ـ ٢ بەرگی ٤

٢ ـ بیبلۆ گرافیای کتێبی کوردی ـ ل ١٩

وەك لەو بیبلیۆگرافیایەدا دەردەکەویت لە سالی ١٨٦٠ ز لەدایك بووەو مامۆستاکەی مەلا زەکی بەگ دەلیت : [ ئەمین فەیضی بەگ خەلکی سلیمانی یەو کە یشتوتە پایەی میر ئالای تۆپچی لە سوپای عوسمانیدا ئەدیبیکی بە ئەمەك و لە زانستیە کانی ماتماتیکدا زور زانا بوو . پاش حوکمی مەشروطیەت خانە نشین کراودوو چاری نەخوشی ئیفلیجی بوو . چەند سالیك لە خەستەخانەکانی ئاستانەدا بەدەم ئەم نەخوشی یەوە تلایەوە تا لە ئەنجامدا سالی ١٩٢٨ ز لە یەکیك لە ( مەلبەندەکانی بەك کەوتە ) کانفدا کوچی دوایی کرد . لە کوردە خوینی گەرم و بەغیرەتەکان بوو دەربارەی نەتەوەکەی ، یەکیك بوو لەسەرە بەستیوانەکانی بزووتنەوەی زانستی و ئەدەبی . دوژمنی خوی و خەلك خوشەویست بوو . ژیانیکی سادەو ساکار دەژیا ، سەرباری ئەو پایەو شوینەی لە سوپادا هەیبوو . چەند ئاساریکی بەقەوارە بچووك و بەناوەرۆك گەورەی بو بەجی هیشتین .

کتێبی ( اجمالی نتایج ) کەپوختەی دەلقی زانستیی ماتماتیك و سروشتەو کتێبی « هەوای لەسیمی » کەدەربارەی ئاوو هەواو کاروباری فیزیك و کیمیایەو کتێبی «تەفرەقەی ریاضیە» کە باسی بنەرەتییەکانی زانستی جەبر دەکاو دیوانەکەی کە بەناوی ( شـوعاعات ) ەوەیە و بریتییە لە شیعرەکانی خۆی بەیادگار بۆ بەجێ هێشتوون .

سەرەرای ئەمانەش سەرگوروشتەی ژیانی کۆمەڵێك شاعیرو ئەدیبی کوردو نموونەی زۆر پارچە شیعری ئەمانەی کۆکردەوەو لە کتێبێکدا بەناوی ئەنموومەای ئەدیبانی کورد ەوە چاپی کرد . هەموو ئەم بەرهەمانەی لەچاپخانەکانی ئاستانەدا بەچاپ گەیاندووە .

ئەمین فەیضی بەگ بەشێکی زۆری لە بەهرە و مەیدانی شیعرو ئەدەب پێ برابوو . بیستیشم کەبەئەندامێتی لیژنەی زانستی ( ئاکادیمیای ) ی پاریس وەرگیرا بوو . مەدالیایەکی بە خەلات

وەرگرتووە . شاعیری ناسراوی کورد شێخ رەزای تاڵەبانی یەکجار رێزی لەبەر دەگرت «۱» .

مامۆستا رەفیق حیلمیش دەڵێت : « ئەمین فەیضی بەگ یەکێکە لەزانایانی بەناوبانگی کورد عەسکەرێکی عالم و ئەدیبێکی عەسکەر بوو لەزەمانی حوکومەتی عوسمانیدا مدیری مەکتەبی عەسکەری بەغدا بوو . بەیێکی کەم پێش مردنی لەژێر ناوی « ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد » دا کۆ دەلە شیعرێکی هەندێ لەشاعیرانی کوردی لەچاپدا « ۱۳۲۹ » زۆمی زۆر مەیلی لەسەر ریاضیات و ئەدەبیات و لەریاضیاتی عالیدا شارەزایی تەواوی هەبوو . هەرچەندە لەگەل شیعر و ئەدەبدا زۆر شعریك نەدەبوو . بەلام دیسانەوە بەتوستاذی شیعر و ئەدەب ناسراوە و ئە شاعیرە بەناوبانگ و بەسەلیقەکان دەژمێردرێت ، دۆستایەتی بەینی خۆی و شێخ رەزای تاڵەبانی شاعیری مەرە

---

«۱» مشاهیر الكرد و كردستان محمد أمين زكي

بەناوبانگی کوردو موخابەرەیان لەگەل یەکتری
بەشیعر ئەم قسەیەمان ئیسپات ئەکا . ئێمە
تەرجەمەیەکی حالی تەواوی ئەبێ فەیضی بەگمان
لانییە . نەدیوانو نە چەند شیعرو غەزەلێکی
تری کوردی خۆیمان لەژێر چنگا نییەو دەسمان
ناکەوێت . لەبەر ئەوە بۆ ئیسپاتی فەضل و هونەری
ئەمین فەیضی بەگ و پایەی شیعرو شاعیریتی .
بەناچاری دوو ئەجمەدەتمان بەبیرەوەری خۆمان و
شایەتی یەکێك لەشاعیرە زۆر گەورەو بەناوبانگە
کانی دۆستی گیانی خۆی کرد . من ئەگەر لە
بیرم مابێ لەبەینی ١٣٤٠ و ١٣٤١ ی رۆمی ل ە
ولاتی عەرەبیدا بەرەحمەت چووەو بەتەواوی
نازانم لەکوێ نێژراوە . ئەوەیشم لە بیرە
کە لە تەئریخی ١٩١٥ ی میلادی بەگەران لـە
سوریە بوو لەژووری خانێکا لەحەلەب بەنەخۆشی
کەوتبوو ئەچوومە لای بۆ ئاخر جار زیارەتم کرد
بەڕاستی کوردێکی بەجەوهەرو زاناو ئەدیب بوو

زۆریش بۆ هەواو قەڵەندەر مەشرەب بوو «١» .
مامۆستا حوزنی موکریانیش دەڵێت «ئەم پیاوە مەزنە کوردە لەشاری سلێمانی لەدایك بووە ، خوێندنی مەدرەسەکانی ئەوێی کەتەواو کردووە چۆتە بەغدلد مەدرەسەی عەسکەری ئەویشی بە پایان گەیاندووەو چۆتە ئەستەموول لەویش خوێندوویە تا بووە بەئەفسەرو چۆتە سوپای عوسمانی یەوە تاگەیوەتە روتبەی تۆپچی میرئالایی لەو روتبەیەدا تەقاعود کراوە ، شەری جیهانی یەکەمی لەسوریەو حەڵەب بەسەر بردووە . لە پاش هودنەی عمومی ساڵی ١٩١٨ گەراوەتەوە ئەستەموول . لەپاش چەندێك بەنەخۆشی لەرزەك (ئیفلیج) گرفتار بوو لەخەستەخانە خەوت .
ساڵی ١٩٢٢ لەگوڵ خەستەخانە سی بە ئامرورزشتی خودا شاد بوو . کەنەخۆش کەوت هەندێك دراوو کتێبو ئەشیای لەلای هاوشایەکی خۆی بەئەمانەت

---

١ ـ شیعرو ئەدەبیاتی کورد / بەرگی یەکەم / رەفیق حیلمی

دانابوو هێشتا هەر ماٍبوو کــە ئەو هاوشاری یەی

هەمو کتێب و دراوەکەی هەڵکرت و کــەراوە

وڵاتی خۆی . کەاێك ئاساری گرانبای نوسیبوونەوەو

لەناوچوون . ئەو پیاوە مەزنە زمانزانێکی زۆر

بەنرخ بوو : کوردی ، فارسی ، عەرەبی ، تورکی

، فەرەنسایی ، ئەلەمانی زۆر باش دەزانی دەینووسی و

دەیخوێندەوە ، لەژەدە بیاندا زۆرسەرکەوتووبوو ،

هەربەوهۆیەوە بوو لەئەکادیمیای فەرەنسا ئەندامێکی

هەمیشەیی بەرێزو نــرخبوو . کەاێك ئەتلەفاتی

گرانبای خۆی لەدەمی ژیانیدا چاپ کردن . لەوانە

کتێبی ( ئەنجوومەنی ئەدیبان ) کەشـــیعرە

هەڵبژاردووەکانی شاعیرەبەناوبانگەکانی کوردن

کۆی کردبووەوە کردنیە ئەم کتێبەو لەچاپی دان

کــتێبی ( کوردستان ) دیرێکی کــوردستانەو

تەرجەمەی هەندیك پیاوانی کوردە چاپی کرد .

ئەمین فەیضی یەك بەرزترین نووسەرو عالمو شاعرو

ئەدیبو سیهك زوونو تێکەیشتووی کورد بووە .

بۆعەزی نامەیەکی چلۆنی خۆی هەر
لەدایک بوونی تا چاپی نامەکەی دوورو درێژ
نووسیوەتەوەو لەبەرگێکی بچووکدا چاپی کردووە.
تەواوی سەرگوزەشتەو خوێندن و وەزیفەو
مەئموورییەتەکانی تێداوتووە. باسی هەموو هەولەماو
دۆستەکانیشی دەکات، لەوەدەمانەی کەلەئەستەموول
بووە پتر هاوڵنشینی ئەحمەد پاشای بابانی کردووە(۱)
بەدەقی ئەوسێ چوار نێکتەی سەرەوەدا چەند
شتێکی گرنگمان بۆ روون دەبێتەوەو چەندسەرنج و
پرسیارێکیش سەرهەل ئەدەن :
۱ـ هەرسێکیان لەسەر ئەو باوەرەن کە ئەمین فەیضی بەگ
رۆشنبیرێکی گەورە ودڵسۆزی نەتەوەی کوردو
زمانو ئەدەبی کوردیمانە.
۲ـ دووبەرهەمی [illegible]دەربارەی ئەدەبو مێژووی
کوردە بەزمانی کوردی وڵە ئەستەموول چاپی کردوون

[۱] دەنگی گێتی تازە [illegible]مایسی ۹٤٥ ـ ژمارە ـ ۲
بەرگی ـ ٤ حوزنی موکریانی

یەکێکیان (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد) وئەوی تریان دەربارەی مێژووی کوردو ناودارانی کوردەو تائێستا ئەو کتێبە بەنیسبەت کتێبخانەی کوردی یەوە بێ سەروشوێنەو لەجێگەی نەبووانە .

٣- پایەی زانستی و رۆشنبیری ئەدەبی بەرادەیەک بەرز بووە کە ئەندامی ئەکادیمیایی فەرەنسا بووە .

٤- پەیوەندی یەکی گیانی تەواو قوول و بێ سنووری لە گەل شێخ رەزای تالەبانیدا بووە بەچەشنێک کەزۆر جار ئەمین فەیضی بەکێ بەشانازی یەوە ئەم بەیتەی شێخ رەزای دووبارە کردۆتەوە

کەتەشریفی شەریفی هات ئەمین فەیضی بەمیوانی
لەموعدەی شوکری دەرناچم مەگەرخۆم کەم بەقوربانی

٥- دەبێ ئەوئەسەرو چمساوانەی کەلەسەردەمی ئەخۆشیدا بەئەمانەت لای هاوشاری یەکی دانساون چی بێ و ئەو هاوشاری یەکی بێت و تۆزێلێ لەو یادگارە بەنرخانە مابێ و ئەوەی ئەهاوشاری یەش بیانپارێزیت ودەست رۆشنبیرانی دلسۆزو کتێبخانەی کوردیان بخاتەوە

٦- ئایا وەك رابەرێك و رۆشنبیرێکی مەزنی کورد ئەم پیاوەمان فەراموش نەکردووە و لەلایەن نووسەران و دەزگا رۆشنبیرییەکانمانەوە، بەتایبەتی کۆری زانیاری کوردی جاران و دەستەی کوردی کۆری زانیاری عیراقی ئێستاوە هیچ هەوڵێك بۆ دەرخستنی پایەو پەیوەندی ئەم نووسەر و زاناکەورەیەدراوە و زانراوە رادەی پەیوەندی ئەم لەگەل ئەکادیمیای فەرەنسادا چی یەو کۆڤارو کتێبەکانی ئەستەموول و پاریس چیان لەسەر نووسیوە ؟

وەك لەئەنجامی گەران و پشکنینێکی سەرەتاییدا لەشاری سلێمانی کەمەلبەندی ئەسڵی و زێدی ئەمین فەیضی بەگە بۆمان دەرکەوت کە خۆی ناوی ( محەمەد ئەمین )ە. فەیضی بەلەقەبێکی شیعری و پێناسەی خۆی داناوە، ( بەگ ) ەکەیشی وادیارە بەسایەی پایەو پلەی سەربازییەوە وەرگرتووە، ئەگینا بەگزادە نییە . باوکیشی ناوی

قــادر ئاغايە كەبەدەروێش قادر ئــاغا ناسراوە .
كە چوومە بنج و بناوانی ئەم وشەی ( دەروێش )ە
. لەلای تاتەخوشكێكی كەناوی [ فاتمە خــان ]ە و
تەمەنی ئێستەی بەتەقدیری من لە [ ٧٥ ]سال زیاترە
وتی : دایكی قادر ئــاغای باوكمان پێش لە دایك
بوونی باوكم چەندمنداڵێكی بووە كچ ئەبوون و ئەمردن
تەنگێدم دەچێت بۆ بەغدا بەنیازی زیــارەتی
غەوسی بەغداو لەوێ ئەپارێتەوە كەشەرت بێ ئەگەر
ئەمجارە كوری بوو بیكات بەدەروێشی شــێخ
عەبدولقادری گەیلانی . دوای ئەوە كورێكی
دەكەوێتە سكەوەو كەدەبێت نــاوی دەنێ دەروێش
قادر و ئەكەدەروێشی شێخ عەبدولقادرە، لەبەر ئەوەش
كەكورە ئاغا بوو بەدەروێش قادر ئاغا ناسرا .
لەبارەی ژن هێنانیشەوە هەر فــاتمە خــانی
خوشكی وتی : ئەمێنەبەگی كاكم كچی نــەقیبی
بەغدای مارە كردو گواستیەوەو دوای سێ مانگ
ژنە كە نەیتوانی هەرجەكانی كاكم بەرێتە ســەر

ئەمیش ناردی بەوەمالی باوکی و دەستی بەرداری بوو، منـالیشیان، وەك من بزانم، ئەبوو لەسـەراغی کتێبـو ئەسەرو چیەماوەکانی کاکیی خوشکی وتی : ئەوە دەی من ناکامانی بە دوو ستـ وتی کەووە کتێب دەفتەرو کافەری بەئەمانەت لەمالی
( حاجی مەلی ئاغا ) لەپەنەدا بەچی هێشتووە نازانم ماوە یان نا وچی یان تیایە . ئەوەلامی پرسیاریکیشدا وتی : کاکەم وتی لەچەند ئاغایەکی سلێمانی هەلـاو سلێمانی بەجێ هێشتو ئیترنە گەڕایەوە تا بەئاوارەیی لەئەستەمبوول سەری نایەوە . تەنانەت دایکی لـە حاجی ستەفا پاشای یامۆلکی بیستووە کەزۆر لە گەلی خەریك بووە کەتەنامەتی گەڕانەوەی بۆشاری سلێمانی پێ بکات و لە ئاوارەیی دا ئەو ئرخەمانی یە کەئەبوو هەمان بێت . ئەمین فەیضی بەگ پێی وتوە : ئیتر هەرچیم هەبوو لـە ژێـــر گلدایە . یەك ئاوە خوشەکی زەمینە نەبێت ، منیش دڵم لەسلێمانی هەلکەنراوەو نازە حەزناکەم بگەڕێمەوە

دلم ناکرێتەوە ، چۆن هاتوومە دەرەوە یا هەر لێرەش بمرم .

شێوەی ژیان و گوزەرانیشی ، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەوامەتی باش بووە ، زۆر پەتەنگ خۆیەوە نەبووەو سۆفی مەشرەب و زەنگی بووە . پێم وایە وشەی (فەیضی)ش کە بۆ خۆی کردووە بەلەقەب هەر لەزۆر زەبوو خۆشەویستی فیوضاتی تەوریکاو بیرو باوەری ئاینی و سۆفی گەرێتی یەدابووە کە پەیرەوی کردووە .

لەم ساڵانەی دوایی دا بەعەدا شاعیری لاو (ئەحمەد تالانە) کتێبێکی تورکی بەناوی (شاعیرانی سەردەمی تورك) دەست کەوت لە نووسینی لێکۆڵەرەوەو نووسەری ناوداری تورك و هاوچەرخ و هاوڕێی (ئەمین فەیضی بەگ) مامۆستا (مەحمود ئەمین کەمال)ە کە بەشێکی لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی [ئەمین فەیضی بەگ]ەو پوختەیەکی لە ژمارە(٥٣)ی گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان)دا بڵاوکردۆتەوە .

کاك حسین ئەحمەد جافیش کردی بەهەرەبیو لەرۆژنامەی عیراق ١٥ رۆژی ٩٧٩/٥/٣ بڵاوی کردەوەو هەروەها کاك عبدوڵلا عەدادیش لەژێر ناوی (ئاوەاراتی کورد . ئەمین فەیضی . لاپەرەیەك لەژیانو پوختەیەك لەبەرهەمەکانی) بەعەرەبی لە رۆژنامەی عیراقدا بڵاوکردەوە .

هیوادارم ئەم لەسەرنووسین وسەرچاوانە ببنە هاندەرێکی کاریگەرو دڵسۆزانە پاڵ بەدەزگا رۆشنبیریو نووسەرانەوە بنێت کەورد ورد بکەونە سۆراخو پشکنینی چاکتر دەربارەی ئەم نووسەرە رابەرە گەورە پەمان وتیشکی رووناکتر ئاراستەی کەلو قوژبنو کۆشەوبەرهەمە فەرامۆش کراوەکانی بکرێتەو لەجیهانی ئەدەبیو رۆشنبیری کوردیماندا شوێنو پایەی شیاوی دەست نیشان بکرێتو مافی رەوای خۆی وەربگرێتەو باشتر لە تۆمارێ رۆشنبیرە نەمرەکانماندا پەرەنجو تەقەلاو بەرهەمە رەنگینەکانی هەمیشە هەر بدرەوشێتەوە .

کاکەی فەللاح

# ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد

## تەئلیفی (ئەمین فەیضی) بەگ

مەجموعالیە یەکێکە لەموتەقادیمینی شوعەرای
عەسکەریەو لە حەواصی ئەهـلی سلێمانی یە

مەطبەعەی « تەرجومانی حەقیقەت »
— ئەستەمبول —
ربیع الأول سنه ١٣٣٩

# ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد

ئودەباو شوعەرای کورد زۆرن . لاکین ئاساریان
بەتەواوی جەمع و تەئلیف نەکراوە .. من نیەتم کرد
کەبەعزێ لەئەشعاری کوردی بابان تەبع و نەشر
بکەم . تابزانرێ موڵکی بابان چەند مەنبەعی فەیز و
زەکایە .

لەشیعری هەرشاعیرێ چەندپارچەیەکم ئینتخاب کرد
لەو مونتەخەباتە ریسالەی ( ئەنجومەنی ئەدیبان ) م
هێنایە وجوود . بەم وەسیلەیە طالبان وراغبین
کەمێک خەلاص بوو لە شیعر نووسینەوە لەسەر
دەفتەر پارچە پارچە .

حەزیشم کرد کەلەپێش هەموو شتێک نوبزە لە
ئەوسافی ئەوشاعیرانە بەیان بکەم لەوانە کەشوهرەتیان
هەیە ئەمانەن : مەولانا ـ ئەدیبی شێخ خالید ، مەلا
خضر ، نالی ، شێخ رەزا ، ئەحمەدی کۆر ، مەلا
صالح نامی ، سەیدئەحمەدی ... حیم مەولەوی ، هیجری ـ

کوردی ، سالم ، وسانیه .

نالی خه‌لقی دێیه‌که له‌شاره‌زوور که‌واقیع بووه له ته‌ره‌فی شه‌رقی سلێمانی ، ئیسه‌ی خاك و خۆڵه .

مه‌رحووم ئه‌حسه‌بلی له قه‌ره‌داخ و له سلێمانیدا ئیکمال کردوه قه‌ره‌داخ شه‌ش سه‌عات دووره له سلێمانی یه‌وه نالی بۆ ئیفای حه‌ج چووه‌ته حیجاز . له‌وێ ده‌رحه‌ق حه‌زره‌تی فه‌خری رسل قه‌سیده‌یه‌کی موکه‌مه‌ل و موته‌ووه‌لی نه‌زم کردووه ... چۆته ئه‌سته‌موول له ئه‌سنای سوحبه‌تا له‌گه‌ل ئوده‌باو فوزه‌لای ئه‌وێ گه‌لێ ئاساری فیکر و فه‌طانه‌تی نواندووه‌و زۆر هه‌زمه‌ری ئه‌وه‌چووه بووه . تانیهایه‌تی عومری له‌ئه‌سته‌مه‌و لا ماوه‌ته‌وه. مه‌رقه‌دی دوباره‌کی ئه‌وه‌یه له (ئوسکودار) زه‌کای [نالی] ئینکار ناکری . لاکین ئه‌وه‌نده‌ی سه‌نایعی له‌فزیه ئیستیعمال کردووه پیاو ره‌نگه بڵێ شیعری ئه‌و نه‌تیجه‌ی عیلم و ئیشتیغاله .

شێخ ره‌زا له‌عه‌شیره‌تی تاله‌بانی یه‌له‌قه‌زای بازیاندا هاتۆته دنیاوه . له‌که‌رکووکدا که‌وره بووه ئه‌ویش

وەکوو نالی هەم فەریزەی حەجی تەنھا کردبوو ،
هەم چووبووەوە ئەستەموول . لەئەسنای مولاقاتدا
بەقووەتی زەکاو دیرایەتی خۆی ، کەلێ ئەکا بیرو
لەفازیلی ئەستەموولی ماحوو مەبهووت کردبوو .
یەکێ لەوانە ئەدیبی مەشهوور کەمال بەگ بوو .
باوکی مەرحوومی کە مەشهوورە بە شێخ
عەبدولرەحمانی تالەبانی هەم شێخێکی ساحیب
نەزەر بوو ، هەم شاعیرێکی پڕ هونەر . شیعری
شێخ رەزا ئەوەڵەن وەھبی و فیتری بوو سانیەن کەسی
لەچوار لیساندا شاعیر بوو ، بالخاصە ئەشعاری
کوردی یەی هەموو عیبارەتە لە فەساحەت و بەلاغەت
لەنیکاتی دەقیقەو زەرافەت . ویەھەنی بە یەمەو
مەعلوماتی خاریجی تەقریرە . لەبەشنا رەفاتی
کرد لەحیواری حەزرەتی غەوسی گەیلانیدا
مەدفوونە . دووبەیتی ئاتی کەهی خۆیەتی لەسەر
کێل قەبرەکەی حەك کراوە .
یا رسول الله چەباشد چون سگی أصحاب کهف

داخل جنت شـوم در زمره احباب تـو
او رود در جنت و من در جهنم کی رواسـت
او سگ اصحاب کهف و من سـگی اصحاب تو

لەگەل بەندە موخابەرەی ئەغلەب بەنەزم بوو .
چەند پارچە لەو ئەزمانە کەبۆ بەندەی نووسی
بوو ئەگەرچی فارسیەن بۆ تەبەروك کردم بـە
خاتیمەی ئەم ریسالەیە .

هیجری و کوردی و سالم ئەهلی سلێمانین
شیعریان پر لەراوەت و حاشقانەیە

بۆ ئەوە سەر بەحسی مەولەوی

مەولەوی ئەهلی هەورامانە ( ١ ) لە ساداتی
کیرام و لەمشایخی هیزامی لەقشبەندی یە . خەلیفەی
شێخ عوسمانی تەویڵەیە . مەسەلەکی زوهد و تەقوا
بوو . لەگەل ئەوەش شاعیریك بوو بێ نەزیر .

هەورامان عیبارەتە لەبەعزێ دێهات کە واقیع
بوون لەمابەینی کوردستانی عوسمانی و کوردستانی

---

(١) مەولەوی هەورامی نی یە

ئێراندا .

مەولەوی بەموتتەزای ئـەو مەوقیعە کە تێیدا بووە هیچ چاوی بەشیعری فەرەنگ نـەکەوتووە . لەگەڵ ئەوەش لەسەر ئسلووبی ئەوان شیعری نەزم کردووە . لەقیتعەیەکدا مەسرەعی ئەوەڵی تەقفیە کردووە لەگەڵ میسرەعی سالیس و قافیەی میسرەعی سانی ری ێك خستووە لەگەڵ میسرەعی رابیع . ئەم قیطعەیە لە ئاخری ئەم کتێبەدا نووسراوە . ئەم ئسووڵە خیلافی ئسوولی شوعەرای ئێرانـــەو مەولەوی لەکەســی ئەدیوە . مەحزەن بەخوسـوسی تەبیعەتی خۆی موناسـیبی زاراوەو ئیســـتعمالی کردووە .

لەمابەینی شوعەرای کورددا مەولەوی موقابیلی نیزامی یە . ئەگەرچی لەسەدەی هەوراما... لەسەدەی سلێمانی ئەختێ لەیەك دوورن . ئەمما شیعری مەولەوی ئەدەندە ...نکدراو روح نەوازە ئەهلی سلێمانی لەکۆزرا یدا ئەغلەب شیعری ئەودەخوێننەوە

ناهی ئەهل سلێمانی‌یە . ئیختغالی هەر لەگەڵ عیلم بووە.زۆر وەقتی لەشاری کۆیەدا رایبواردووە شیعری ئەویش رەنگینە .

ئەحمەدی کۆر ئەهل ئەرەفی سابڵاخە عالم نەبووە ئەمما شیعری بە غایەت مـــوزەییەن و غایەت عارفانەیە . ئەولەهتی حەزرەتی رسالەتە کە لەم رسالەیەدا موندەریجە هەمووی مـوزەیـیـەنە بە سنعەتی رەددی عیجز لە سـەرسەدر . ئەحمەدی کۆر لایقە مولەقەب بێ بە شاعیری پێغـەمبەر . کەلامی هەمووی پر سۆزو گودازن .

حەزرەتی مەولانا ضیاءدین شێـخ خالید لە عەشیرەتی میکائیلی‌یە . میکائیلی عەشـیـرەتێکـە لــە لەتراتی سلێمانی گەشـــت و گوـــزار دەکەن . جەنابی شێخ لە سلێمانی و لە ئەترافیا تەحسیلی کردووە. بۆ ئیفای حەج دەچێتە مەککەی موکەررەمە . لەوێ زاتێك پێی دەڵێ کە بـۆ تـۆ فەیزو بەرەکەت لە تەرەفی هیندستانە وە پەیدا

دەبێ . لە پاش ماوەیەکی بۆ سولەیمانی ڕۆژێک
هیندی یەک دێتە لای ، ئەو هیندی یە شێخ
هەڵدەگرێ بەسەر مولکی ئیران و ئەفغانەدا دەیبا
تا داخلی شاری ( دەهلی ) دەکا . حەزرەتی
مەولانا لە خزمەت شا عەبدوللا کە یەکێک لە
ئەولیای کاملین تەریقەتی نەقشبەندی ئیقتباس
دەکا لە زەرفی شەش مانگدا مەئزوون دەبێ بۆ
ئیرشاد دەچێتەوە سلیمانی ، لاکین لەوێ ئیسراحەت
ناکا دەچێتە بەغدا ، لەوێشەوە تەشریفی دەچێتە
شام . لەوێ وەفاتی کردووە . لە مەحەڵەی
( سالحیە ) دا دەفینێ خاکی ڕەحمەت بووە .
شێخ لە هەموو علوومی زاهرە و باتینەدا ساحیبی
ئیقتدار بووە . ، هەر لە تەک تەدریس و ئیرشاد
مەشغوول بووە : شیعر نەزم کردنی نەکردوە بە
مەسلەکی خۆی ، مع هذا مەرتەبەی شاعیریتی
لە مەرتەبەی حافز و سەعدی زیاتر نەبێ کەمتر
نی یە . دیوانی کە بە ئیرادەی سولتان

مەبدولەجیدخان تەبع کراوە ئەگەر تەدقیق
بکرێ سیدقی ئیفادەی ئەمە مەعلووم دەبێ .
ئەمما ئەوەندە هەیە شیعری کوردی کەم کوتووە .
مەعانیی کەشف و کەراماتی زۆرە .

زەرافەتی تەبعی عارف ئەفەندیش شایانی
تەحسینە .

میر ئالای موتەقاعید
**ئەمین فەیضی**

# ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد

بسم الله الرحمان الرحیم

( صدق و سەلامەت )

عیلمی یەقین و حەیاتی سەرمەد
خوفی خودایە و حوببی ئەحمەد

**ئەمین فەیضی**

# و بنا ساكینی كه‌ولن

ره‌بنا ساكینی كه‌ولن چ غـولام و چ ئه‌میر
وه‌كوو یه‌ك ئه‌هلی نیازن چ غه‌نی‌و چ فه‌قیر
به ئومێدی كه‌ره‌مت شام‌و سه‌حه‌ر گریه‌ كنان
ده‌كه‌ن ئیظهاری حه‌قاره‌ت چ گه‌داو چ ئه‌میر
به‌ نه‌ظه‌ر ره‌حمه‌تی تۆوه‌ له‌ نه‌ظه‌ر ئه‌هلی به‌صه‌ر
جومله‌ نزدیكی نه‌جاتن چ عه‌لیل‌و چ كه‌سیر
سه‌طحی دنیا وه‌كو گه‌هواره‌یه‌ بۆ طفلی به‌شه‌ر
شیرخواری كه‌ره‌می تۆن چ صه‌غیرو چ كه‌بیر
كه‌ره‌مێكن له‌ كه‌فی به‌خششی تۆ هه‌روه‌كو خاك
زیومرێكن له‌ حوادیس چ حه‌ریرو چ حه‌صیر

**سالم**

# دڵ دەناڵێ چون ڕوباب

دولبەرا بەی رووی نهاتە دڵ دەناڵێ چون روباب
بەودوو ئەبرۆی میسلی طاقت بەندی جەرگم بوو کەباب
بوون بەبوریان تۆی دەروونم، چاوپڕ ئەسرین، دڵ زەبوونم
مەحبوبا وابۆت جنوونم لێم حەرامە خورد و خواب
خواب و خۆراکم گرینە ، رەحمەتەن للعالەمینـــە
رەحمێ کە بەمنی حەزینە با کوتابێ ئـــەم عەزاب
با کۆتابێ داخ و دەردم ، ناڵە ناڵ و ئاهی ســـەردم
بێ ئەجەل وا بۆ تۆ مردم ، پێم بدە جامێ شەراب
پێم گەرەکە جورعەیە مەی، لەو مەیە مردوو دەکا حەی
مەی بەحاجەت صاحیبی مەی پاڵەبەین لاچێ حیجاب
پاڵەبەین لاچێ حیجابـــا ، مەحبوبی رۆژی خیطابا
وا دەکەم ئەز خۆم حسابا کەمتر ینم ئـەز کیلاب
کەمتر ینم ئەز سەگانە ، ئەز سەگانی پاسەبانە
جانـو دل قوربانی جانە ، گوڵرخی روخ ئافتـاب

ئافتابی شەوقی عالەم ، سەروەری ئەز نەسلی ئادەم
بۆ روسول تۆ بووی بەخاتەم ، ئەی شەهی عالی جەناب
ئەی شەهی لەولاك لەولاك تۆ زنوور ، ئادەم زخاك
جوملەیی شێخ و وەلی پاك بوون جەسایەت فەیضیاب
بوون جەسایەت ئازیەقوربان،مەحرەمی ئەسراری سوبحان
ئەلبی عاصیم هاتە کریان ، لەم سەرە ڕێ مال خراپ
مال خراپ و خەم لە دۆشم ، عاشقی بێهۆش وکۆشم
زووخی جەرگی خۆم دەنۆشم کوورە ئاسا دل بەتاب
کوورە ئاسا دل بە تابم ، لەت لەتە جەرگە کەبابم
وا لە عەشقی تۆ سوتاوم ، کەوتمە حالی ئیضطراب
ئەحمەدی کۆری هەژارە ، چاوەڕێی لوطفێکی یارە
ئەبین ئەدەر بێئیختیارە ، ناپەتە حەدو حساب

ئەحمەدی کۆر

# مەثوای حەبیب

ئەی قوبەیی طیبە کە دەڵێی حوققەیی طیبی
مەئـوایی حەبیبی
مسـکینم و بۆ خاکی مەطر ئاکی کە هاتووم
بەو بۆنەوە هاتووم
هەر چەندە کە من عەبدێ رووزەردمو عاصیم
مەئمولە خەلاصیم
قوربانی بیلالم کە بەلالانـە مەلاتـووم
هەر مەفوە خەلاتم
ئەی مەسـجیدو میحرابکەت قیبلەیی حاجات
بۆ ئەهلی مرناجات
مەحجوویی هەوامو ئەمەتە مەشـهەدی مەعلووم
بۆ راهی نەجاتم
ئەی مەطلەعی ئـەنواری هەموو قاصیو دانی
شەمسی صەمەدانی

وەك زەرەیی بێ جیلوە لەمەوجوود و لەمەعدووم
جۆیایی بەراتم
لەم خاکی دەری رەحمەتە ، بێ زەحمەتە فـالی
هەر حەقوە خەیالی
حاشـــا کە لەمرەدا بیمە ســـائیلی مەحرووم
هەر چەند لە هوصاتم

فـالی

# ئەوا رۆیم لە لاتان

رەفیقان من ئەوا رۆیم لــەلاتان
سەرم قەلغانە بۆ تیری قەزاتــان
بلاسا شار بەشارو دەر بەدەر بین
لەدەس یاران بکەین طەیی ولاتان
مەلێن کەلکی نەبوو رۆژی چەمەندەم
سەرم قەلغانە بۆ تیری قەزاتــان
سەفەرمان چونکە ریی هات و نەهاتە
دوعامان بۆ بکەن ئێوەو خوداتان
منم سەرکردەتان بۆ لەشکری غەم
دەترسم من برۆم بشکێ سوپاتان
ئەوەندە ئەرچو دەکا (نالی) کە چار چار
بکەن یادی موحیبی بێ ریاتــان

نالی

# مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی

مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی کە فەرمووت
دەخیلت بم کە خانەی سەبرەکەم سووت
لە ڕووت و ئاسووتی وەك من ڕوو مەپۆشە
کە وەصلی تۆیە ئاووتی عاشقی ڕووت
ئەوە لیوی ئەتۆ بوو پڕ لە خەندە
کە وا شەککر دەباری کول دەپشکووت
دەکەی تەسخیری سەد دل هەر بە تیری
ئیلاهی هەر بمێنێ دەست و بازووت
چ شۆرینە خەطوطی دەوری لیوت
بەلێ مەعلوومە خۆشە خەطی یاقووت

نالی

# ڕۆژێ نەبوو

ڕۆژێ لەبوو ئەم دولبەرە بێ ڕەحمە وەفا کا
چارێ نەبوو ئەم ظالمە شەرمێ لە خودا کا
حەیرانن ئەطیبا لە عیلاجی مەرەضی من
لوقمانی ویصالی مەگەر ئەم دەردە دەوا کا
کارێ کە غەم و دەردی فیراقی بە منی کرد
سەرما بە هەتیو با بە دەواری شڕی ناکا
دیوانەیە شەخصێ کە بەخەیری لەبی لەعلی
وەک شاهی سکەندەر طەلەبی ئاوی بەقا کا
تاب و تەبی تاتەشکە دەبێ هیجری وەکو شەمع
نزدیکە منیش واردی صەحرایی فەنا کا
لەم ڕێگەیە تەقدیری ئەزەل وابوو کە ئێمە
پامالی جەفا بین و ڕەقیب سەیرو صەفا کا
ڕۆح و دل و دین هەر سێ دەکەم بە زل و یساری
کامی دلی من کەو ئە لەبی لەعلی ڕەوا کا
سەردانی لە ڕێی عەشقی ( ڕەزا ) لازمە عاشق
بۆ یاری سەرو مالی هەدەف تیری قەضا کا

# خودا وەقتێ کە حەزکا

خودا وەقتێ کە حەزکا بەندەیێکی خۆی بکا خۆشنود
لەرێگەی دوورەوە بۆی دێ بەپێی خۆی شاهیدی مەقسود
لە هیندوستانەوە شەش مانگە ڕێ تا خاکی کوردستان
خودا شێخ ئەحمەدی هێندی ڕەوان کرد بۆمەلا مەحموود
مەلا مەحموودەی زەنگنە یەعنی قوطبی دائیرەی ئیرشاد
لە دەورەی مەرقەدی هەر بانگی یاهوو دێتەو یامەعبوود
لەپاش ئەوئەرشەدی ئەولادی شێخ ئەحمەدلەجێی دانیشت
بێ عەیبی وەک سولەیمان جێ نشینی حەزرەتی داوود
بەرەحمەت چوون ئەوان ها پێکەوە سەربەحسی ئەورەحمان
لیدای بم لەی نەتیجەی خانەدانی ئەحمەدو مەحموود
نەتیجەی مەقصەدە تالی و موقەدەم شەرتی تەحصیلن
لەوانەی بۆ یەیە ئیجاد کرد خودا ، تا ئەم ببێ مەوجوود
ئەمیستەش شێخ عەلی بالا نشینی ئەوجی ئیرشادە
ئەویش وەک باوک و باپیری لە زومرەی ئەولیا مەعدوود
ڕەزاش لەو ئەسلەیە بی بەخشە یارەبی کە قەت نابێ
گوڵی بۆخارو بەحری بێ بوخارو ئاتەشی بێ دوود



شێخ ڕەزا

# سائیل بەغینا قائل ئەکا

سائیل بەغینا قائل ئەکا بەخششی کەمتان
تالی بەبە یاخوا ئەرزێ دەستی کەرەمتان
هەر چەند بەمەسەل خەنجەری ئەلماسە زمانم
نابڕێ سەری موویە لەئەدای شوکری نیعەمتان
گێڕانی کەدای کردووەتە کانی جەواهیر
تەکسیری نیساری زەڕو شاباشی دەرهەمتان
ئێوەن بە حەقیقەت مەلەکی میللەتی کوردان
شایانە زیادەت بکرێ خاکی قەدەمتان
ئینکاری حقوقیان لەسەر ئەم میللەتە ناکرێ
نابایی فەرەیدوون فەرو جەمشیدی حەشەمتان

## شێخ رەزا

# عەشایەر بوون بە یەك

عەشایەربوون بە یەك تا ڕیچەمان دەرکەن بەیەکجاری

جەبـــاری و داوەدو کاکەییەکانی دایە ڕیـــز بـاری

قەسەمیـان خوارد بە ڕۆح سەبراکەو کورخانی ئەحمەد

بە کەللەی خوك و شاخی کاوە حۆل و گۆشتی مرداری

دەبێ ئەمڕۆ بە جارێ قەطعی نەسلی طالەبـانی کەین

تەق و تۆقیـان کە هەستان کوللە هەروەك تەرزە داباری

سوارەی طالەبانی دەرپەڕین وەك ڕزسقەمی دۆستان

فیراریان ئیختیار کـرد سوارەکانی باوە یادکاری

فیراری کاکەیی هەر نەیسە ، لەبا کونی فەلەك کەربوو

لە جەرت و پرتی ئاغای داودە و ساداتی جەباری

شێخ ڕەزا

# فەردم نەمرۆ

لە کونجی بێ کەسیدا فەردم ئەمرۆ
زەلیل و زار و بێ هەمدەردەم ئـەمرۆ
لەسۆزی عەشق و سەردی میهری تۆیە
دەروونی گەرم و ئاهی سەردم ئەمرۆ
گەواهی لافی عەشقی ئاژیە ، ئوریـان
سروشکی سورخ و رەنگی زەردم ئەمرۆ
ئەگەر سروەی نەسیمی وەصلی ئەو بێ
موعەطەر کا دلی پر د ردم ئـەمرۆ
صەبا نامەی زەلیل و بێ کەسی مـن
بەرە بۆ یاری دل وەك بەردم ئەمرۆ
لەعەرصەی وەصفی ئەو مەحبووبەلەنگە
خەیالی وەك سوارەی حەردم ئـەمرۆ
لەبۆ وەصفی جەمالی یاری (کوردی)
ئەگەر رۆحم نەدەم نامەردم ئەمرۆ

کوردی

# ئەگەر مەهلەت لە دڵ دەرکەم

ئەگەر مەهلەت لە دڵ دەرکەم غەریبی کۆیی دولبەر بم

ئەگەر ساتێ لە یادم چێ هیلکی زەخمی ئەژدەر بم

بە غەیرەز بۆسەیی لێوت ئەگەر قەسدی ویسالێت کەم

بە شوعلەی قەهری تۆ یارەب سەراپا میسلی ئەخگەر بم

ئەگەر یەك لەحظە سستی کەم لەژێر باری غەمی عەشقت

بە میسلی پەنجەرە قوربان بە تەنی سوراخی خەنجەر بم

لەسەر تەعریفی ئەگریجەت ئەگەر بێم وەسفی گێسووت کەم

بە زەربی تیغی سەرپەنجەی ئەجەل مەقتوول و بێسەر بم

ئەگەر یەك لەحزە غافڵ بم لە شەوقی ماهی روخسارت

لە حەشرا بێ نسیبی جەننەت و هەم حەوزی کەوسەر بم

گەدایی کۆیی جانانە بە شاهی عالەمی نادەم

گەدایی خۆشترە بۆ من لە شاهی کەو موخەییەر بم

ئەلای یاران بڵا ( هوجری ) لەبۆتەی فیرقەتا ئەمجار

خولاسە بێغەش و مەقبوولی عالەم هەروەکو زەر بم

هیجری

# عیشــق

کوللی عالەم رابوون سەر گەشتەوو حەیرانی عەشق
هیچ کەسێ نازانێ ئەحوالی سەر و سامانی عیشق

ساحە پەیمایانی ئیدراك و كەمالی عارفان
لەنگ و عاجز بوون لەبەر طەی کردنی مەیدانی عیشق

گەرچی غەواصانی فیکرەت غوطەوەر بوون مودەتێ
قەت نەبوون واقیف لە قەعری بەحری بێ پایانی عیشق

سامیری و سەحبان و چارەللاهو لوقمان و سەطیح
موخبیری کوللی علومێك بوون و سەرکەردانی عیشق

حافظ و سەعدی و نیظامی قەیس و جامی و دەهلەوی
فەیض خواهو مەعرفەت جۆ بوون لە شاگردانی عیشق

خەسرەوو مەحموود و فەرهاد هەرسێ شاو شازادە بوون
ئاخری بووشن بە عەبدو چاکری سوڵطانی عیشق

شەمس و مەولاناو مەنصوور کەی بەسر مەحرەم دەبوون
کەر نەیان خواردایە ریزەی نان لە سفرەو خوانی عیشق

زاهید ئەو خوێندووتە تەفسیری ( لکل وجهة )
ئەت مەدە طەعنە لە دەستی بێخودی رەندانی عیشق

موڵتەجی نابێ بە کەس ( هیجری ) لە دنیاو ئاخرەت
رۆژی دیوانی خودا دەستی من و دامانی عیشق

هیجری

# شەھرەزوور کیشوەری

ئیمرۆ بە دواپەری شەھرەزوور کیشوەری
ساھەلسە دەی بنێرە سەرت تاجی سەروەری
چیھرەت بەھەیئەتێکە لەناو شامی طورەدا
دەربێ سەحەر لەبورجی ئوفق شەمسی خاوەری
خەیری کولاھەکەت کەھرما سایە جۆیە لەو
کەس ئێ ی نەدا موقابیلی تۆ لافی ھەمسەری
ناکا کەسێ بەسەھلو بەموفتی شکاری تۆ
ئاھوویی دەبدەمەستو طەبیعەت غەضەنفەری
سا شەرحی وەصفی تۆ بەچ وەجھێ بکەم ئەدا
ھەرچی خەیالی من ھەیە دەیلیمو بەر تەری

سالـــم

# جیهان ئارایەمە

جیهان ئارایەمە ئەمرا ئەوەك رووت

هیلالی یەکشەبە تاکە ئەبەرووت

لە لەبعا مەنبەعی ئاوی حەیاتە

دەڵێی ڕێی ظولمەتە هەرسوو لەگیسووت

هەوای سیبی زەنەخ ئەی دل مەکە تەو

موحەییایە لە ڕێدا چاهی هارووت

کە تۆ غائب دەبی تاریکە چاوم ،

دەڵێی نوقطەی بەسەرمە خالی هیندووت

لەباغا غونچە مەشقی لێوی تۆی کرد

ئەخرسێن گوڵ لەخەندەی تۆوە پشکووت

سالم

# نۆبەی نەظەرە

لە طەرەف یارەوە نۆبەی نەظەرە
ئەی دل ئامادە بە خوێنت هەدەرە
تەشتی پڕ خوێنە بە دانیم سینەم
ئامۆژەت بۆ رەگی دل نیشتەرە
وەزنی یەك بۆسەوو جەورمی سەروجان
لە ترازوویی ئەوا سەر بەسەرە
بۆ کەسێ صوحبەتی مەعشووقە ئەبێ
حاصلی هەردوو جیهان دەردی سەرە
طالبی وەصلی کەسێکم بە دوعا
وەصلی فیردەوسە ، فیراقی سەقەرە

سالم

# دوێنێ لوێژی شێوان

له دوکه‌ی سینه دوێنێ نوێژی شێوان
به‌یانی دا - فیده‌ی باغی سێوان
له خوفی طه‌لعه‌ت رۆژ هه‌ر وه‌کو شێت
به روو زه‌ردی هه‌لآتو که‌وته کێوان
دوچاوی من که‌را که‌یل سروشکن
ده‌پێون ئاوی به‌حری خوێ به پێوان
مه‌که‌ن لۆمه‌ی په‌شێوی دل ، که ئه‌مڕه‌ی
په‌شێواوه له‌به‌ر په‌رچه‌م په‌شێوان
شه‌راب لعلی ومه‌مانی له [ نالی ]
حه‌رامه بێ مه‌زه‌ی ماچێکی لێوان

نالی

# ئەو قاقمە موعتازە

ئەو قامەتە ممتازە کەوا خاصەیی شاهن
ئاشوبی دلی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن

صف صف کە دەوەستن بە تەرزی خەطی شوعاعن
حەلقە کە دەبەستن وەکوو خەرمانەیی ماهن

نێرگس لەکەڵ ساقی سپیێ کەرکە وەنەوشەن
موو سونبل و رووەت گول و هەم لالە گولاهن

گولزاری دەرو دەشتی و غیلمانی بەهەشتن
ئاهو صەف و ئاتەش بە کەف و تیر نیگاهن

صەحرا بە تەجەللی دەکەنە وادیی ئەیمەن
قامەت شەجەر و مەظهەری ئەلطافی ئیلاهن

کەە طاوس و کەە کەبکن و کەە بزۆنە مووتی
کەە شوعلەوو کەە ئاتەش و کەە دوودی سیاهن

لایق بە بەدەن ئەطلەس و ئەخضەر کە دەپۆشن
ئەورەستە گول و بەستە لەگەل دەستە گیاهن

بۆ سەیری خەرامیدەنی ئەو سەروو قەدانە
سۆفی لە طلە لەبدان و هەموو سالێکی راهن

## نـــالی

---

ئەو تاقمە موستازە عەسکەری حکومەتی بابانە کە لە
زەمانی ئەحمەد پاشادا تنظیـــم و تەنسیق کراون

# تا فەلەك دەوری نەدا

تا فەلەك دەوری نەدا سەد كەوكەبی ئاوا نەبوو
كەوكەبەی میهری موبارەك طەلعەتی پەیدا نەبوو
تا نەكرا ئاسمان و ئەم ولاتی دانەكرت
گول چەمەن ئارا نەبوو ، ئەم لێوی غونچەوانەبوو
تا چەمەن پەرانە سەر ئەصلی درەختی لانەدا
فەرعی تازە خورەم و بەرزو بلند بالا نەبوو
تا سولەیمانان نەبوولە صەدری تەختی ئاخرەت
ئەحمەدی موختاری ئێمە شاهی ئەخت آرا نەبوو
بۆ نیشاطی مورغی رۆحی ئەو كە حالی فیطرەتە
جێگەیی خۆشتر لە رەوضەی چەنەتەلمەئوا نەبوو
وەك قیاسێكی كە موسەبەتی نەتیجەی بێتە جێ
حەمدو لیللا شەە كە حاكم جابوو خالی جانەبوو
شاهی چەمما ( نالیا ) نەزریشی جەم ئەعریشیە
ئانەاین لە عەصرەدا ئەسكەندەری جەم جاەبوو
نالی

---

ئەو تەئریخە دەرحەق وەفاتی سلێمان پاشاو جلوسی ئەحمەد پاشایە

# برازا عەزیزەکەم

رووم کردە بەزمی خاصی برازا عەزیزەکەم
ئەمجەو بەسەدتەواضوع و ئیخلاص و سەرکزی
زۆریم لە درزی قاپیەوە خۆی و تاییمان
دانیشتوون دوو ریزە لەدەورەی خلەی کەزی
کوتیان تەمێ کراوە بەمەخصوصی قاپیەوان
خۆی کردە بەلێرە تورك و گوتی: کیم بیلیرسەنری
پێم گوت مەگەر ، قلاّنە کەسم ،مامە شێخ رەزام
بیلمزمیسین خمیس تەفەندی دیمك بری
وەقتێ کەلەم موعامەلە زانیم غەرەز چی یە
دەرحال کەرامە پاشەوە ئەمما بە عاجزی

## شیخ رەزا

# بەرخە نێر

قەومەکان بەو زاتە وا حوکمی لەسەر بەحرو بەرە

بەرخە نێری گەر نەنێرێ هەر کەسێ صاحیبمەرە

دینم یەکتریا دەی مرم گەر فیلمەسەل شێری نەرە

یا نەقەومیت و نەزانن ئەم هەموو شۆرو شەرە

کەفت لەسەر پۆلی شەل و کاوری گەرو بەرخی لەرە

**شێخ رەزا**

# هاتۆتـــە گۆشی

مەگەر نالیتی من هاتۆتـــە گۆشی
کەوا کردوویە ئەرکی سورخ پۆشی
بەهاری گولهەنی حوسن و جەماڵە
بەسوخمەی سەوزو نیمتای سادەپۆشی
خەڵاڵی دولبەری و شۆخی کە دەدرا
لەپاش یوسف موزەیەن بووبە دۆشی
فەلەك تۆش عاشقی وەکمن کەئەمەو
خەریکی ناڵەو و گریە و خرۆشی
مەدە وەعظم لەتۆبەی عیشق . واعظ ؟
ئەگەر صاحیب کەماڵو عەقڵو هۆشی
لەمن بەدتر دەبی زاهید ئەگەر تۆش
شەرابی دەسـ تی مەحبووبی بنۆشی
غەوەز بۆنەرتی (کوردی) بوو کەئەوتا
ئیتر بۆ کی‌یە نـــازو خود فرۆشی

**کوردی**

# رۆحی شیرینم نەهات

چیھتم ئەمرۆ زەھری مارو رۆحی شیرینم نەھات
زەخمی کۆنەم ھاتە ژان و مەرھەمی برینم نەھات
غەم سەری ئینداو و یارم ئەت سەرێکی لێنەدام
سەبرو ھۆشم رۆیوە، چارەتکەری دینم نەھات
دل دەسووتێ چین بەچین دەشکێتە سەر یەك وەك نەئەر
صاحیبی رووی ئاتەشین و زولفی چین چینم نەھات
من غەمم خوارد و غەمیش خوێنی جگەرمی خواردەوە
بۆیە گریام چەند بە چەند فرمێسکی خوێنینم نەھات
دیدە وەك ھەوری بەھاران خوێن دەگرینێ و صەدای
پێکەنینی غونچەیی ئەو سەبزە پەرژینم نەھات
کوێ ضەرم چەوکانی میحنەت دایە بەرخۆی رای رفاند
ئەلعەجەب بۆ شەھسواری خانەیی زینم نەھات ؟
کەوتمە وەقتی نەزع و غەم خستوومیە حالی غەرغەرە
(کوردی) بێ کەس بووم لەھیچ لایێ صەدای شینم نەھات

کوردی

# دەروون زامدارە

دەروون زامدار و دل خەمگینە بۆ تۆ
سەرم گێژ و ئەلم بێ تیفە بۆ تۆ
خەوم بێ هۆشی یە ، بەرگم پەلاسە
خۆراکم خوێنە ، شادیم شینە بۆ تۆ
جێگەم سەحرایە وەحشم یار و هاوەنگ
درک ئەرش و کوچک بالینە بۆ تۆ
سەرم سەمتووڕ و سینەم چەنگ و دل دەف
خەفەت یار و مەقام نالینە بۆ تۆ
رەقیب رووگرش و ئەشکی دیدە سوێرە
حەیات تەلخ و ئەجەل شیرینە بۆ تۆ
زستان مەیلەکەی پاییز براکەم
بەهاری خوەرو دین هاوینە بۆ تۆ
ئەوا من بووم بە شاو سولتان و والی
تۆخوا سا کاکە گیانی ژینە بۆ تۆ

**کوردی**

# حیسابی نەفحەی زولفت

حیسابی نەفحەیی زولفت لەگەڵ میشکی خەتا فاسکەم
خەتا ناکەم ، سەبا شاهیدمە تەعبیری وەما ناسکەم
لە دورجی سینەما تا گەوهەری یادی روحی تۆ بێ ،
لەبەر شوعلەی ئەوا شەب تا سەحەر مەیلی چرا ناکەم
لە سەحرای شـــورەزای عەشقی جانانە گیا هێکەم ،
بەبێ بارانی ئەنظاری ئەبەد نەشـــو نما ناکەم
بزانم گەر لەقەبرا بۆی دەمی فیضی لـە خاکم دێ ،
هەتا دەمرم لــــە دنیا زەخمی خوێنینم دەوا ناکەم
لە میحرانا سەحەر وەقتی فەنا ئیلتوری چیهرەت بێ
لەبەر تاڵی بڕۆی تۆ روو بەمیحرابی دوعا ناکەم

سالم

# خوماری میحنەتی دنیا

بە هەل کەبن یا بە نەشئەی مەی خوماری میحنەتی دنیا

( الا یا ایها الساقی أدر کأساً و ناولها )

موحەببەت زۆر بە ئاشووبە بە سەهلی تۆ مەکەن یاران

( که عشق آسان نمود اول ، ولی افتاد مشکلها )

کە بادی صوبحدەم ئەفشان دەکا گێسوویی پڕ چین

( زتاب جعد مشکینش چه خون افتاد در دلها )

دڵا مەچێ بڵێ قاصید لە نێک و بەد بەجێی بێنە

( که سالک بی خبر نبود ز راه و رسم منزلها )

محەببەت ، [illegible] محلەتە دنیا ، رەفیق لەمرۆ زۆ خەتەر دایە

( جرس فریاد میدارد که بربندید محملها )

لە بیمی مەوجی دەریای ئەهلی دل راهید خەبەردارین

( کجا دانند حال ما سبکباران ساحلها )

قصەی [illegible] شەرمەیی شەهرە تەمامە تازە بی پۆشم

« نهان کی ماند ان رازی کزو سازند محفلها »

وەصالی دولبەرە سالم موعەظەم تر لە هەر مەطلەب

« متی ما تلق من تهوی دع الدنیا واهملها »

سالم

# غەبغەب و خالو لەبو طورە

غەبغەبو خالو لەبو طورەیی یار
سونبل و سێب و بنەفشەو گولنار
تا لەلای یارە لەرەحناسکە دلم
جێژی لە گولزارە بەبێ فەصلی‌بەهار
گەرچی ئاوێنە دەبێ تیرە لە ئـاه
ئامە ئارایشە بۆ چیهرەیی یـــار
وەک کەسێکم لەجنون بازیی میحق
بێتەدەر موفلیس و رسوا لە قومار

سالم

